**پێشکەشە**

بـــە :

× هاوڕێی دڵسۆزم دکتۆر عبدالرزاق مطلك .

× خوێندکارانی کوردستان .

# بە ناوی یەزدانی مەزن

من هەر لەزووەوە کەقوتابی بووم لەبەشی مێژوو، بیرم لەوە ئەکردەوە کەشتێ پێش کەش بە قوتابیيانو پەرتوکخانەی کوردیمان بکەم دەربارەی شۆڕشانی گەلانی جیهان ، لە ژێر ناوونیشانی ( زنجیرەی شۆڕشانی گەلانی جیهان ) وەبە شێوەیەکی کورتو لە شێوەی چیرۆك بینووسم تاکو هەموو خوێندکارێکی کورد کەڵکی لێ وەربگرێت . وە ئەوەی زیاتریش هانی دام بۆ ئەم کارە دوو شت بوو یەکەمیان هاوڕێی دڵسۆزم مامۆستا دکتۆر عبد الرزاق مطلك بوو . دووەمیشیان هەژاری پەرتوکخانەی کوردیمان لەم

جۆرە پەرتوكانە ٠ وە یەكەم شۆڕش ، شۆڕشی كوبامان هەڵبژارد چونكە ئەتوانم بڵێم كە شۆڕشی كوبا شوێنێكی تایبەتی لای هەموو ڕۆشنبیران هەیە وە كەس نی‌یە ناو بانگی نەبیستبێ چونكە تاقی كردنەوەیەكی زۆر مەزن بوو كە بە ماوەیەكی كەم توانی بە مافی خۆی بگاتەو ئاواتی چینی چەوساوەكانی كوبا بگەیەنێتە جێ ٠٠٠٠

شۆڕشی جەزائیریش نامیلكەی دووەممانە بەیارمەتی خوای مەزن ٠

جا لێرەوە تكا لە خوێندەوارانی بەڕێز دەكەم كە ئاگادارمان بكەنەوە لە كەموكورتی ٠٠٠ وەلێشمان ببورن پێشەكی ٠ ئیتر ئاواتمان سەركەوتنی هەموو لایەكە بۆ دەوڵەمەند كردنی پەرتووكخانەی كوردیمان٠

عبدالله محمد علي

هەولێر

٢٨ – ٧ – ١٩٨٣

# چۆنیەتی دۆزینەوەی کیشوەری ئەمریکا

لە کۆتایی سەدەی پازدەهەم و سەرەتای سەدەی شازدەهەم جوولانەوەیەکی زۆر بەهێز بەرپابوو لە وڵاتە ئەوروپایی‌یەکان بۆ دۆزینەوەی ئەو شوێنانەی کە لەوان ون بوون • ئەمە لەلایەك ، و لەلایەکی ترەوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی • بەلام ئەوەی شایانی باس بێت هەمووی بۆ داگیرکردنی گەلان بوو ، لەگەڵ دەست بەسەرگرتنی ژیانی ئابووریان وە لەلایەکی تریشەوە بۆ پەیداکردنی بازاڕێك کە کەل‌وپەلی خۆیانی تیا بفرۆشن ، ئەم جوولانەوەش لە سەرەتاوە لە وڵاتی ئەسپانیا و پورتوگال دەستی پێکرد ، لێرەدا خوێندەواری بەڕێز مافی هەیە گەر پرسیار بکا ، کە

بۆچ ئەم جوولانەوەیە لـە ئەسپانیاو پورتوگـال دەستی
پێکرد ؟ وە بۆچ لـــە بەریتانیـا دەستی پێ نەکرد ،
گەرچی مێژووی بەریتانیا کۆنترە لە هەردووکیان ؟ ! .
لە وەڵامدا دەڵێین پرسیارەکـە زۆر رەوایـــە وجێی
خۆیەتی . لێرەدا دەبێ ئێمە بزانین کە بۆچ ئـەم دوو
وڵاتە بەم کارە گرنگە هەڵسان . ئەوەی شـایانی باس
بێت هەروەك لای هـەموو رۆشنبیرێك ئاشکرایە کـــە
وڵاتی ئەندەلس کەوتە ژێر حوکمڕانی موسڵمانەکان
لەساڵی ٧٧١ز تا وەکو سـاڵی ١٤٩٢ز . ئینجـــا پاش
ســـاڵی ١٤٩٢ز پەیوەندی ئەندەلس لەگـــەڵ وڵاتە
موسڵمانەکان بڕا لە هەموو بارێکی ژیانەوە وە لە هەمان
کاتیشدا ئەندەلس بوو بە دوو بەش : لە لای رۆژهەڵات
وڵاتی ئەسپانیا ، وە لەلای رۆژئاوا وڵاتی پورتوگال .
ئەم بڕانی پەیوەندی‌یە لە نێوان ئەسپانیـــاو پورتوگـال
لەگـەڵ وڵاتە ئیسلامەکان دەورێـکی باڵای بەخشیە
شاری ڤینیسیا (البندقية) بەتایبەتی و شارانی تری ئیتالیـا

بەکشتی کـــە هەڵسن بەکاروباری بازرگانی لەنێوان ووڵاتە موسڵمانەکان ( بەتایبەتی لە سەروی کیشوەری ئەفریقیا ) لەگەڵ ئیسپانیاو پورتوگال • ئەم کـارە وای کرد کـە کەلەپووری بازرگانی نرخی زۆر گران بێت لـەم دوو ووڵاتە • لەهەمان کاتیشدا وای لێ‌کردن کـە بکەرێن بەدوای شوێنی تر کـە پەیوەندی بازرگـانی لەگەڵدا بـکەن بەتایبەتی لەگـەڵ هیند • چونـکە لای زانایەکانیان ئاشکرا بوو کە زەوی خڕە • ئینجا هـــەر لەبەر ئـــەم هۆیە بوو ویستیان بچن بۆ هینـــد بەلای رۆژئاوا ، بەڵام لـە هەمان کاتدا بیریان لەمە دەکردەوە کە کێ هەیە بەم کارە هەڵسێ ؟ بەڵام رۆژگـار مرۆڤی خۆی بۆ هەڵکەوت کـە بەم ئیشە پیرۆزە هەڵسێ ئـەم مرۆڤەش ناوی (کریستۆفەرکۆلۆمبس)(١) بوو کـــــە

---

(١) کرستۆفەر لە ساڵی ١٤٥١ ز لە شاری جەنوای ئیتالی هاتۆتە جیهانەوە ، هەر لە منالیەوە عەشقی دەریا بوو ، شارەزاییەکی زۆری پەیدا کردبوو =

ساڵی ١٤٨٤ز داوای لە (ئەمیر جۆنی دووەم) کرد کە
پاشای پورتوگال بوو بۆ ئەوەی دەستی یارمەتی بۆ درێژ
بکەن کە بەم کارە گرنگە هەڵسێ ، بەڵام ئەمیر (جۆن)
بڕیاری دا کە لێژنەیەك پێك بێت لە پیاوانی کنێسەو
زانایانی دەریا تاوەکو رای خۆیان دەربڕن بۆ هەڵسانی
ئەم کارە ، بەڵام پاش وتووێژ بڕیاریان لەسەر نەداو
قەدەغەیان کرد ، ئەوەی شایانی باسە هۆی ئەم
قەدەغە کردنە تا ئێستا نەزانراوە بەتەواوی ..!. پاش
بڕیار لەسەر نەدانی ئەم کارە ( کۆلۆمبس )
پورتوگالی بەجێ هێشت و بەرەو ئەسپانیا چوو لەساڵی
١٤٨٥ز . هەر لەهەمان ساڵدا داوای لەشاژنی قشتالە

=

لەم بابەتەوە . لە ساڵی ١٤٧٦ ز جەنوای
بەجێهێشت ، بەرەو لشبۆنە کەوتە رێگا . پاش
سێ ساڵ گەڕاوە جەنوا ، لە ساڵی ١٤٧٩ ز
بە یەکجاری جەنوای بەجێ هێشتو هاتە
پورتوگال ، ئینجا بەرەو ئیسپانیا تاوروکو
ساڵی ١٥٠٦ ز ماڵ ئاوایی کرد لە جیهان .

کرد که ناوی (ئیزابیل) بوو ، له شاری قورتوبه ئه‌میش پێشنیاره‌که‌ی ئاراسته‌ی لێژنه‌یه‌ك کرد ، ئینجا پاش شه‌ش ساڵ ماوه‌ی درا بۆ پێ هه‌ڵسانی ئه‌م کاره مه‌زنه ، پاش ئه‌مه‌ی بۆی روون کردنه‌وه که مه‌به‌ست له‌و کاره هیچ شتێ نی‌یه ، ته‌نها بلاوکردنه‌وه‌ی ئاینی مه‌سیحی‌یه .

## به‌رێ کردنی کۆلۆمبس بۆجاری یه‌که‌م

له مانگی ئابی ساڵی ١٤٩٢ز هه‌موو شتێ ئاماده کرا بۆ به‌رێ کردنی کۆلۆمبس ئه‌مه‌ش پێکهاتبوو له سێ که‌شتی گه‌وره ، ناویان له سه‌رۆکه‌که‌یان نا ( سانتاماریا ) تا بلێی جوانیان رازاندبۆوه به خاچ و شتی تر ، و چه‌کی باشی ئه‌و سه‌رده‌میان بۆ ئاماده کردن ، وه‌ك تۆپ . ئینجا دوای ئه‌و هه‌موو ئاماده کردنه ( کرستۆفه‌ر ) له‌گه‌ڵ هاورێ‌کانیان چوون بۆ دێر

( کنێسه ) دانیـــان به گوناهه‌کانیان نا(٢) ، ئینجـا بـه ئاهه‌نگ به‌ڕێ کران لـــه شه‌وێـــکی مانـگه شه‌ودا به گۆرانی و ده‌سته و دوعا ، تا وه‌کو دووربن لــــه هه‌موو ناخۆشیه‌ك و به‌سه‌لامـــه‌تی بـگه‌ڕێنه‌وه • پاش ئۆغر کردنیان به تێپه‌ڕ بوونی چه‌ند رۆژێك ، چاویان به هیچ وشکایی نه‌که‌وت ، زۆر په‌ست بوون وترسی گیانیـــان لێ په‌یدابوو ، وه هه‌موو به‌تێکڕا ( کۆلۆمبسیان ) تاوان بار کـــرد ، به‌ڵام ئه‌ویش وره‌ی به‌رنه‌داو زۆر به‌هێــز بوو ، دڵی هاوڕێـکانی ده‌دایه‌وه به‌وه‌ی کـــه‌وا دان به‌خۆیان بـگرن و په‌نا به یه‌زدان ببه‌ستن ، هه‌رده‌گه‌ن به ئاواتی خۆیان ، هاوڕێـکانی زۆربه‌یان له‌گه‌ڵ ئه‌مـــه بوون که بگه‌ڕێنه‌وه بۆ ئه‌سپانیا ، به‌ڵام کۆلۆمبس دانی به قسه‌ی وان دانه هێناو به‌گوێ‌ی نه‌کردن ، تا وه‌کو

(٢) ئه‌مه شتێکی باوه له نێو مه‌سیحیه‌کاندا . ترسـی مردن یان شتی نادیار بکه‌ن ، دان به گوناهه‌کانیان ده‌نێن ، که باوه‌ڕیان وایه پـاك ده‌بنـه‌وه لـــه گوناهه‌کانی وابردوویان به‌م کاره •

١٢ی تشرینی یەکـەم چاویان بە شوێنێکی ووشـکایی کەوت ، وە زۆر پێ دڵخۆش بوون و کەوتنە سەما ٠٠٠ کۆلۆمبس ناوی لـەم ووشکایی‌یە نا ( سان‌سلفادۆر ) ، یانی رزگار کەری پیرۆز بەڵام هـەر کـە دانیشتوانی شوێنەکە چاویان بەم کەشتیانە کەوت ، زۆر ترسـان ، چونـکە هیچ شتی وایان نەدیبوو لەمەوپێش ، لـە لایان وەك فریشتە وابوو ٠٠٠ ئینجا کـە نزیك بوونەوە لـە یەکتر ، کۆلۆمبس شتی دانێ بـە دیاری وەك ئاوێنـە ، ناوی نان بە ( هنود ) چونکە وای زانی گەیشتۆتە هیند ٠ دوو رۆژ لایان ماوە ، پاشان شەش کەسی لەوان لەگەڵ خۆیدا برد بۆ دۆزینەوەی جێـگای تر ٠ وە لـە ٢٨ی تشرینی یەکـەم گەیشتە ( کولبا ) واتـە کوبا ، ئینجـا کۆلۆمبس بەردەوام بوو لـە گەڕانەکـەی تاکو ٤ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٤٩٣ز گەڕایەوە ، پاش ئەوەی (٢٢٤) رۆژیان پێ چوو ٠٠ کـە گەیشتنەوەووڵات ، تا بڵێی زۆر بە گەرمی پێشوازیان لێ کردن ، پاش ئەوەی

که خەڵك نەمانیان بۆ دانابوون کـــە لە نـاو چووینە ، ئەمەش لە بەرئەوە کە زۆریان پێ‌چوو •

ئینجا ناوونیشانی ( ئەمیراڵ ) یان بەخشـی بـە ( کۆلۆمبس ) و هەڵیان‌بژارد بە یاریدەدەری پاشـای ئەسپانیا لە هیند ، چونکە ئەوان هەر لەسەر ئەم ڕایە بوون کە گەیشتونەتە هیند •

## کۆلۆمبس جارێکی تر دەچێتەوە هیند :ـ

پاش ئەوەی کە جاری یەکـەم گەڕانەوە ، بەبـێ تەنگ‌و چەڵەمە بوو ، دیسان بڕیاریان دا بـگەڕێنەوە ، بەڵام ئەو جارە بە شێوەیەکی تر •

١٧٧ کەشـتیان برد لەگـەڵ ١٢٠٠ مـــرۆڤ لـە دەریازان‌و سەرباز ٠٠ بۆ ئەوەی دەست بە سەر هینـد بگرن ٠٠٠؟ بەڕێ‌کەوتن لە ئـەیلولی ساڵی ١٤٩٣ ز ، ئەمجارەش سەرکەوتنی زۆریان بەدەست هێنا ، هـەر

بۆیە زۆر جاری تریش چوونەوە ، بەڵکو کۆلۆمبس خـۆی تەنیـــا چوار جار چوو ، بەڵام جاری چوارەم هیچ پێشوازیەکی بۆ نەکرا ••• وە زۆر خەمبار بـوو بەم کارە تاکو کۆچی دوایی کرد لە ساڵی ١٥٠٦ ز •

## کــوبا

یەکێکە لە وولاتەکانــی کیشوەری ئەمریکـــای ناوەڕاست ، دەکەوێتە سەر دەریای کاریبی • کەوتۆتە نێوان هێڵی درێژی ٧٤ر٨° – ٨٤ر٨° رۆژ ئـــاوای گرینتش ، هەروەها کەوتۆتە نیوان هێڵی پانی ٩ر١٩° – ٢٣° لە باکوری هێڵی ئیستیوا •

رووبەرەکەی ٤٤ر٢١٨ میل دووجایــەو ژمارەی دانیشتوانیشی (٩) ملێون کەس دەبێ ، زۆربەیان لە سەر ئاینی مەسیحین : بەشێك کاثۆلیك‌و بەشی دووەمیـــان پرۆتستان ، ژمارەیەکی کەمیشیان جوولەکەن ، خەریکی بازرگانین ، زۆربەی دانیشتوانی کوبا بە زمانی ئەسپانی

وتوویژ دەکەن، بەڵام زمانی رەسەنیان هیندیە سوورەکانە ( الهنود الحمر ) لەگەڵ ئەمەشا زمانی ئینگیزیو فەرەنسیش بەکار دەهێنن لە گفتو گۆ کردنا ، زۆربەی خەڵکی کوبا خەریکن بە کشتو کاڵ کردن ، لە ووڵاتە بە ناوبانگەکان دەژمێردرێ لە چاندنی شەکردا • باران لە هەر چوار وەرزی ساڵدا دەباری ، بە تایبەتی لە هاویندا • ئەم ووڵاتە شاخی زۆری لێیە ، بەرزترینیان ۱۸۰۰م لە ڕووی دەریاوە بەرزە • وە زۆربەی شاخەکان دەکەونە سەر رۆخی دەریا ، وە بەناوبانگەکەیان ( سیرامایسترایە ) •

کوبا دابەش دەکرێ بە پێنج هەرێم کە ئەمانەن :

**١ ـ هەرێمی ئۆرنتی :**

ژمارەیان زیاترە لە ملیۆنو نیوێكو لە شارە بە ناوبانگەکانی ، ئەلتوسونکۆ ، ئەنتیلا ، سانتیاگۆری •

٢ ـ **هەرێمی کماکۆی**

لە شارە بەناوبانگەکانی شاری مۆرەن •

٣ ـ **هەرێمی لاسفیلاس :**

ژمارەیان دەگاتە دوو ملیۆن‌و نیو ، ماتزاز لە شارە بەناوبانگەکەیانە •

٤ ـ **هەرێمی مانتنازاس :**

بە ناوبانـگترین شار هاڤانایـە کـە پایتەخـتی کوبایـە •

٥ ـ **هەرێمی بینارد‌ل‌ریویە :**

مارتینز بە ناوبانگترین شاری ئەم هەرێمەیە •

# داگیر کردنی کوبـا

هەروەك لەمەوپێش باسمان کرد کە کۆلۆمبس لە مانگی ئابی ١٤٩٢ز ئەسپانیای بەجێ‌هێشت‌و بەرەو هیند

کەوتە ڕێ •• وە لە ڕۆژی ٢٨ی ئۆکتـۆبەری سـالّی ١٤٩٢ز کوبای دۆزیەوەو زۆر دڵی پێخۆش بـوو ، ووتی : ( ئەمە جوانترین شوێنە کە مرۆڤ چاوی پـێ هەڵبێ ) هەر ئەمەش بوو وای لە کۆلۆمبس کرد کـە گەڕایەوە ئەسپانیا ، داوای لە کاربەدەستانی ئەسپانیا کرد بۆ دەست بەسەر داگرتنی کوبا • زۆر باسی خۆشـی کوباو ئاوو هەوای سروشتی بۆ کردن ، تا لـە کۆتایی دا وای لێ کردن کە دەست بەسـەر کوبادا بـگرن ، بەڵام ئەم کارەیان دواخست تا وەکو سـالّی ١٥٣٩ ز واتـە پاش کۆچ کردنی کۆلۆمبس بە ٣٣ سـاڵ • سوپایەکی گەورەیان نارد لە ژێر فەرماندەی (کورتیز) ، بەڵام هەرکە سوپا گەیشتە نزیك کەناری کوبا ، گـەلی کوبا زوو هوشیار بۆوە.بەگەنج و پیرو ئافرەت و منالّەوە، بەربەرەکانی ئـەم کارە ناڕەوایە راوەستان سـەرەڕای ئەوەی زۆریان لێکوژرا کەچی هـەر رشت تر دەبوون لەسەر بەربەرەکانی بەرامبەر داگیرکەران • وە لەهەمان

اساندا داگیرکـــەران بەبێ بەزەیی لێیان دەکوشتن و
ارووادیان بەکـار هێنا لەگەڵ گـــەلی کوبا بێجگە لــە
سووتاندنیان ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەلی کوبا هـــەر
رشت تر دەبوون لە بەربەرەکانیان • بەڵام لـــە کۆتایی
دا ( کورتیز ) توانی کوبا داگیر بـکا لەگەڵ ئەوەشـــا
گەلی کوبا ناڕەزایی خۆیان دەردەبڕی بەرامبەر دوژمن
بە هەموو جۆرێك ، بەڵـکو لە ۲۲ی کانوونی دووەمی
ســـاڵی ۱۸٤۸ز خەڵـکی شاری (مانزاتیلۆ) پێشوازی
( جیروزمینیدز ) یانی کـرد کـــە قارەمانێك بوو دژی
بێگانە ڕاوەستابوو وە گەلی کوباش بــە هەموو شێوەیەك
پشتگیری ئەم قارەمانەی کرد لە پێناو بــەدی هێنـانی
سەربەخۆیی • بەڵام زۆری نەخـــایاند ئەم قارەمانەیان
کوشت ! وە لە ساڵی ۱۸٦۸ دا شۆڕشێکی تر بەرپابوو
لــە کوبا وە زیاتر لە (۱۰) دە ساڵی خـــایاند بەڵام
سەرنەکەوت ، گەرچی زیانێکی زۆری لە دوژمن دا •

دیسان لە ساڵی ١٨٩٥ز دەستیان بە شۆڕش کرد تاوەکو ساڵی ١٨٩٨ز گەلی کوبا لەژێر سەرکردەی پاڵەوانی میللی (جۆرێ مارتی) توانی دوژمن دەربکا لە خاکی کوبا ئەویش بە یارمەتی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو بەلام گەلی کوبا نەی دەزانی ئەنجامی ئەمەی دوایی‌یان زۆر خراپترە لە هی‌پێشتر •

## وولاتە یەکگتووەکانی ئەمریکا و رزگار کردنی کوبا

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم ، چینی چەوساوەی کوبا زیاتر نارەزایی خۆیان دەربڕی بەرامبەر بە ئەسپانیای داگیرکەر ، وە لە هەمان کاتدا باوەڕیشیان بەمە هەبوو کە کوبا هەردەبێ بۆ کوبایی‌یەکان بێ و هیچ درێغیشیان نەکرد لە تێکۆشان ، بەلام زۆر شت هەبوو کاری تێ کردبوون بەرامبەر دوژمنیان ، ئەویش

بە شێوەیەکی سەرەکی کەمی چــەك بوو • چونـکە زۆربەی گەلی کوبا هەژار بوون نەیان دەتوانی چەکی باش بـکڕن • ئینجا لێرەدا بورجوازیەکانی ئەمریـکا ئەمەیان بەهەڵ زانی بۆ دەست تێوەردان لـــە کاروباری گەلی کوبا ، وە دەتوانین بڵێین بە تەواوی دەستیان بەسەر پیشەسازی شەکر گرت ، ئەمە لەلایەك ، وە لەلایەکی ترەوە ئەم هۆیانەی خوارەوەش وای لێکردن کە زیاتر خۆیان لەگەلی کوبا نزیك بـکەنەوە بۆ دەست بەسـەر گرتنیان •

**١ ـ نزیـکی خاکی کوبـا لە وولاتــە یەکگرتووەکانــی ئەمریکا •**

**٢ ـ بەکارهێنانی بەندەرەکانی کوبا ، بۆ هێرش بردنـە سەر دوژمنانیان لە کەناری ئۆقیانووسی ئەتلەنتی•**

**٣ ـ بەپیتی و بەرەکەتی خاکی کوبا •**

**٤ ـ بوونی قازانجی بێ سنوور لە پیشەسازی شەکر •**

**٥ ـ هەبوونی کەرەستەی خاو بۆ بەکارهێنانی لە پیشەسازیدا ، لە ئەمریکا •**

**٦ ـ چەنگ کەوتنی کرێکار بە پارەیەکی کەم بۆ ئیش کردن •**

**٧ ـ نەهێشتنی بیروباوەڕی نەتەوایەتی لە کوبا •**

**٨ ـ کردنی کوبا بە بازاڕ بۆ فرۆشتنی بەرهەمی خۆیان •**

هەروەها (مۆنرۆ) کە سەرۆکی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو لە ساڵی (١٨٢٣)ز باوەڕ نامەیەکی دەرهێنا کە پێکهاتبوو لە زیاتر لە (١٠)بەند • یەك لەم بەندانە ئەمەبوو کە وولاتە ئەوروپایییەکان هیچ مافی ئەمەیان نییە دەست لەکاری کیشوەری ئەمریکا بدەن بە هیچ جۆرێ ، وە لەهەمان کاتیشدا رژێمی ئەمریکا مافی ئەمەی نییە دەست لەکاری وولاتانی ئەوروپا بدات •

گەرچی ئەم باوەڕنامـــەیە لەکـاتی خۆی شتێکی گرنــگ بوو ، بەڵام لەدوای کۆچ کـــردنی (مـۆنرۆ) سەرۆکەکانی ڕژێمی ئەمریکا ئەمەیان کردە بەڵــگە بۆ دەست تێوەردان لەکاری وولاتانی کیشوەری ئەمریـــکا بەگشتی و کوباش بەتایبەتی •

هــەر لەبەر ئەوە دەبینین ( جیفرسون دایفست ) وەزیری بەرگری ئەمریـکا لە ساڵی ١٨٥٤ز داوا لـــە ڕژێمی ئەمریکا دەکات بۆ دەست گرتن بەسەر کوبا • وە لەهەمان ساڵدا ئەسپانیا لـــە کوبا دەستی بەســـەر پاپۆڕێکی ئەمریکا داگرت کە ناوی (بلارك واربور) بوو ، چونــکە بەپێی یاسای دەریایی نەجولابۆوە • ئەم کارەش بووە هۆی وتووێژ لەنێوان هەردوو ڕژێم لـــە ( مەدرید ) پاتیەختی ئەسپانیا وە لەهەمان ساڵدا ئەمریـکا بەڵێنیدا بە ئەسپانیا کـــە ١٠٠ ملێون دۆلاریان بداتێ

بەرامبەر بە بەجێهێشتنی خـاکی کوبا ، بەڵام رژێمی ئەسپانیا بەم کارە رازی نەبوو، رۆژ لەدوای رۆژ ناخۆشی بەهێز تر ئەبوو لەنێوان هەردوو رژێم تا وەکو سـاڵی ١٨٥٨ز ، یەکێ لە پیاوەکانی رژێمی ئەمریکا لەیەکێ لە وتارەکانی‌دا روونی کردەوە ( کە دووارۆژیان لەگەڵ کوبایە جا هـەر ئەبێ دەستی بەسەر دابگرن وە ئەمەش پێویست بە ووتووێژ ناکـا چونـکە کوبا بەشێکە لـە کیشوەری ئەمریکا ) بەڵام گەلی کوباش هەر بەردەوام بوون لە خۆپیشاندان و لێدانی سوپای ئەسپانیا بە یارمەتی ئەمریـکا ، وە لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٩٨ز کەشتیەکی ئەمریـکا بەسەرەردان هات بۆ کوبا کـە ناوی ( مـان ) بوو ، گەیشتە ( هاڤانا ) ، پێشوازیان کردو رێزیان لێ‌نا • بەڵام لـە شەوی ١٥ی شـوباتی ١٨٩٨ز پاپۆڕەکە تەقیەوەو ٢٦٠ کەسی تێدا فەوتا لەناو ٣٥٠ کەسدا • رژێمی ئەمریکا ئەم کارەی کردە بەڵگە

بۆ ئەوەی زیاتر رابوەستی بەرامبەر سوپای ئەسپانیـا لە خاکی کوبا • ئەسپانیای تاوان بارکرد ، گەرچی رژێمی ئەسپانیا ئەمەی بەدرۆ دەرخست کە ئەوان هیچ پەیوەندیان بەم کـــارەوە نی‌یە ، بەڵام بێ ســوود بوو • رۆژنامە نووسەکانی ئەمریکا ئەم کارەیان زۆر بەگرنگ دانـاو بەناوی گەلی ئەمریکا داوای تۆڵە سەندنەوەیان دەکرد لە ئەسپانیا • چینی بورجوازیەکان زیاتر هانی ڕۆژنامـــە نووسەکانیان دەدا بۆقووڵ کردنی ئـــەم مەســـەلەیە ، ئەمەوای لە کۆنگرێسی ئەمریکا کرد کە پەیام نامـەیەك دەرکا و تیایدا روون بـگاتە وەکە ( ئەمریکا بەپێ ویستی دەزانی کە ئەسپانیا دەست لەســەر کوبا هەڵبـگرێ و سوپاکـــەی بگەڕێنێتەوە شوێنی خـۆی ) • وە ئـــەم خالانەشی دیارکرد :

١ـ گەلی کوبا دەبێ ئازادبێ •

**٢ـ سوپای ئەسپانیا دەبێ بەزووترین کات خاکی کوبا بەجێ بهێلێی .**

**٣ ـ میری ئەمریکا داین بەمە دادەنێ کە خۆشی بگەڕێنێتەوە کوبا و کیشوەری ئەمریکا .**

لە هەمان کاتەدا سێ رۆژ ماوەی دا بەسوپای ئەسپانیا بۆ بەجێ هێشتنی کوبا . وەپەیوەندی بڕا لەنێوان ( واشنتۆن ) و ( مەدرید ) لە ٢١ی نیسانی ١٨٩٨ز . ڕژێمی ئەسپانیا ئاشکرای کرد کە ئەم کارەی رژێمی ئەمریکا پەردەیە بۆ دەست بەسەر داگرتنی کوبا ، بەڵام ئەمریکا ئەمەی بەدرۆ دەرخست ووتی : مەبەست رزگارکردنی گەلی کوبایە و بەس .

پاش تەواو بوونی سێ ڕۆژەکە ، سوپای ئەمریکا دەستی کرد بەهێرش بردنە سەر سوپای ئەسپانیا و ناوی لەسوپای خۆی نا ( سوپای رزگاری ) .

لە کۆتاییدا توانیان هاڤانا بگرن و ـــ ـــ ـــەزۆر زیان لە سوپای ئەسپانیا بدەن ، تا وەکو ناچاریان کرد بۆ

داواکردنیان بۆ راوەستانی جەنــگ • بەڵام ســەرۆکی ڕژێمی ئەمریکا (ماکنیلی ) چەند شتی چەسپاند لـــە ســــەریان پێش دەست کـــردن بەگفتوگۆ ئــەویش ئەمانەن :

**١ ـ بە جێ هێشتنی کوبا بە زووترین کات •**

**٢ ـ بەجێ هێشتنی پۆرتۆریــکۆ و دوورگــەی گـــوام لەباسفیك بۆ ئەمریکا •**

**٣ ـ کشانەوەی سوپای ئەسپانیا لەم شۆینانە •**

لە سەر ئەم بەندانە گفتوگۆ کرا •

لە ١٠ی کانوونی یەکەمی ١٨٩٨ز کوبا سەربەخۆیی وەرگرت لە ئەسپانیا ، بەڵام ڕژێمی ئەمریکا ئەم کـارەی بۆئەوە نەکرد بوو کــە گەلی کوبا بێنە سەرخوانەیەکی حازرو بەکەیفی خۆیان بجولێنەوە • وە لە ١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٩٩ ڕژێمی ئەمریکا دەستی بەسەر کوبا داگرت و خۆی چــەسپاند بەفەرماندەی (لێونارد وود )

به هه‌نجه‌تی گێڕانه‌وه‌ی هێمنی و ئاسایش لـــه کوبا •
به‌ڵام ئایا ئه‌مه ڕاست بوو ـ ـ ؟ ! نه‌خێر ڕژێمی ئه‌مریکا ڕۆژ له دوای ڕۆژ زیاتر خۆی تووند ده‌کرد له کوبا و ده‌ستی به‌سه‌ر زه‌وی و زار ده‌گرت و به‌پێی پێویستی خۆی سه‌ره‌ك کۆماری بۆ داده‌نان • یه‌که‌م ســـه‌ره‌ك کۆمار ناوی (تۆماس باسترا داباڵما ) بوو •

# گه‌لی کوبا به‌رده‌وامه له‌شۆڕش و ڕاپه‌ڕیـــن

گه‌لی کوبا هیچ درێغی نه‌کرد به‌قوربانی گه‌نجه‌کـانی بۆ رزگـارکردنی خاکی کوبا له‌ده‌ست بێـگانه تا وه‌کو ساڵی ۱۸۹۸ز ئامانجه‌کانی هاته‌دی و سوپای ئه‌سپانیـــا کشایه‌وه له کوبا •

به‌ڵام ئه‌م سه‌رکه‌وتنه زۆری نــه خایاند ، چونــکه ڕژێمی ئه‌مریـــکا خۆی چه‌سپانده سه‌ر گه‌لی کوبا و

داگیری کرد .له ۱ی کانوونی دووەمی ســـاڵی ۱۸۹۹ز ئینجا دیسان گـــەلی کوبا دەستی کـــرد بەڕاپەڕین و شۆڕش ، بەڵام ئەمجارە دژی ڕژێمی ئەمریــکا ، کـــە دوێنی دۆستی بوو ، ئەمڕۆش خاکی لێ داگیر کرد ـ ! لێرە دا بە کورتی لەسەر ئـــەم ڕاپەڕین و شۆڕشانە ی گەلی کوبا دەڕۆین یەك لەدوای یەك •

## شۆڕشی ساڵی ۱۹۱۲ز

هەروەکو لە مەوپێش باسمان کرد ، دووبارە گـەلی کوبا کەوتنەوە ژێر دەسەڵاتی بێـگانە بـــە هـــەموو چینەکانیەوە •

ساڵی ۱۹۱۲ ڕەشەکانی(۳) کوبا بەشۆڕش هەڵسان ، چونکە لای هەموان ئاشکرایە کـــە ئیمپریالیزم دەستی

(۳) مەبەستمان ئەمەیە لەڕەش ، چونکە گەلی کوبـــا لەڕەنگی ڕەش وسپی پێك هاتووە •

بەسەر هەر شوێنێك داگیر کرد ، جیـــاوازی دروست دەکات لـە نێو هاو وولاتیان بە هەموو چەشنێك جا چ هەژارو دەوڵەمەند یان ئاینی یان لەنێو ڕەنگی ئادەمیزاد، سپی ورەش هتـد واتە بە چاوێـکی تەسك ســـەیری ڕەشەکانی گـەلی کوبای دەکرد و وایان دەزانی کـــە ئەمانە بۆ خزمەتی وان دانراوان‌و ئیشیان پێ بکەن بێ پارە • بەڵام ڕەشەکانی گەلی کوبا دژی ئەمە هەڵسان و دەستیان کرد بە شۆڕش لـە سەرانسەی سنووری کوبا دژی داگیر کەری ئەمریکا ، بەڵام ئەوەی جێگای داخـە هەموو چینی کوبا بەشداری نەکرد لەم شۆڕشە بەتایبەتی سپی‌یەکان لە ئەنجامدا شۆڕشەکە سەرنەکەوت •

# شۆڕشی ساڵی ١٩١٧ ز

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خەڵـکی کوبا زیاتر هەوڵی دەدا بۆ ئەوەی ڕێزەکـانی خۆی ڕێك بخاو دەست بـــکەن

بەشۆڕش • چونـــکە ڕژێمی بەکرێ گیـراوی کوبا بەتوندی ئازاری خەڵـکی کوبای دەدا بەبێ جیاوازی • ئیشیان بەکرێکار دەکرد بەپارەیەکی زۆر کەم کەبەشی مەسرەفی ماڵ و منالی نە دەکرد : ئینجا هەموو گـەلی کوبا بەرە یە کیان پێکهێنا کە هەموو چینی گــەل بـە شداریان تێــدا کرد وەك مامۆسنا ، بازرگان ، قوتابی ، جوتیار کرێـکار ــ ــ ــ ــ جـــا هـەموویان بە شۆڕش هەڵسانەوە ، زۆر شوێنیان ڕزگار کرد ، لە هەمان کاتدا زیانێکی باشیان گەیاندە بەکرێ گیراوەکانی ئەمریکا • میری کوبا نەی توانی دەست بەســـەر شۆڕشەکەدا دا بگرێ ناچار داوای لەڕژێمی ئەمریکا کرد کە سوپای بۆ ڕەوانـــە بـکات ، ئەویش درێغی نەکردو ســوپای بۆ ڕەوانە کردن لەژێر فەرمـــاندەی (کرۆدر) ، وە بەبێ بەزەی یانە شۆڕشەکەیان لە ناوبرد پاش ئەوەی زیانێکی زۆریان لێ کەوت • ئینجا (کرۆدر) دەستی بەفەرمـــان ڕەوای کوبا کردو پێنجساڵ فەرمانی گێڕا لە کوبا •

باجی زۆری چەسپاندە سەر گەلی کوبا •

## ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٣٣ز

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئازارو ئەشکەنجە زیاتر دەبوو لەسەر گـــەلی کوبا ، جا هەردەم چاوەڕوانی دەرفەتێك بوون بۆ سەندنی مافی خۆیان ئەمە بوو لە ساڵی ١٩٣٣ز هەڵســـان بەڕاپەڕینێك دژی ڕژێمی دکتـــاتۆری کوبا (ماخادو) زیانێکی زۆریان لێـــدان • بەڵام ئەمجارەش سوپای ڕژێمی ئەمریکا بەسەرۆکایەتی (باتیستا) یاریدەی ڕژێمی کوبای داو ڕاپەڕینەکەی لە ناوبرد ، لە هەمـــان کاتدا (پاتێستا) هاتە سەر تەختو (ماخادۆ)ش هەڵات بۆ دەرەوەی وولات •

## ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٤٤ز

پاش ئەوەی (پاتێستا) فەرمان ڕەوایی خۆی چەسپاند

بەسەر کوبا ، دەستی کرد بـــە ئازاردانی خەڵــکی کوبا بەهەموو جۆرێك، وەکو زیادکردنی باج ، گران کردنی نرخی کەل و پەل وەکرێی خانوو •

**گەلی کوباش زۆر بە توونديەوە لەســـاڵی ١٩٤٤** چەکی هەڵــگرت دژی ڕژێمی (پاتێستا)و دارو دەستەکەی بەڵام (پاتێستا) ڕای کرد بۆ (واشنتن) پاش ئەوەی کە ١٠ ساڵ فەرمان ڕەوای کرد ، بەڵام نۆکەرانی ئەمریکا داوا یان لەڕژێمی ئەمریکا کرد کەپاتێستا بگەڕێنێتە وە کوبا• ئینجا (پاتێستا) لەگەڵ سەربازێکی زۆر گەڕایەوە بۆ سەر فەرمان ڕەوای کوبا و راپەڕینەکەش بەم شێوەیە دوایی هـــات •

# هۆیەکانی سەرنەکەوتنی ئەم ڕاپەڕین و شۆڕشانە

هەر وەکو لە مەوپێش باسمان کرد کەگەلی کوبا

بەردەوام دژی ئەم ڕژێمە کۆنە پەرستانەی کەڕژێمی ئەمریکا دای دەنان لە سەر فەرمـــان ڕەوایی کوبا ڕادە وەستاو بەربەرەکانی کرد ، قوربانی دا بە هەموو چینە چەوساوەکانی گەلی کوبا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجامی باش نەبوو ، شۆڕشەکە وەیا خـــود ڕاپەڕینەکە لەناو دەبرا ، هۆیەکانی لە ناوبرد نیش ئەمانەی خـــوارەوە بوون :

١ ـ هاوکاری کردنی ئاغــاو دەوڵەمەندە کـــانی کوبا لەگەڵ داگیر کەران بۆ هێنانەدی ئامانجی خۆیان •

٢ ـ نەبوونی سوپای سەربە خۆیی کـــە پێکهاتبێ لەگەلی کوبا •

٣ ـ نەبوونی پارتێکی پێشڕەو کـە بتوانێ هــەموو چینەکانی گـــەلی کوبا لـــە ژێر ئاڵای خـۆی کۆبکاتەوە و ڕیزەکانیان یەك بخات •

٤ ـ کەمی چەك و هەژاری زۆربەی گەلی کوبا •

٥ - بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری لـە ناو زۆربەی گەلی کوبا •

# هەڵبژاردنی سەرەك کۆمار لە ساڵی ١٩٥٢ز

لە ژێر ناوی پیرۆزی دیموکراتی ، رژێمی کۆنەپەرست لە کوبا بەردەوام بوو لە گرتن و تێ هەڵدانی گەلی کوبا - - - سەرەڕای ئەمەش لەنێوان چەند ساڵێك هەڵبژاردنێکی دەکرد بۆ دانانی سەرەك کۆمار !• ئـەم هەڵبژاردنەش بە زۆری وابوو ئەفسەرە کۆنـەپەرستەکان خۆیان دادەنا بۆ هەڵبژاردنەکە • لە سـاڵی ١٩٥٢ز دەستیان کرد بە بانگەوازێ بۆ خۆ هەڵبژاردن • یەکێ لەوکەسانەی کەخۆی ئامادە کرد بۆ هەڵبژاردنەکە گەنجێکی کوبی بوو کـە ناوی (فیدل کاسترۆ) بوو • بەڵام (پاتێستا) هەرکە زانی دەرناچێ ، بە یارمەتی سوپا

کۆدیتایەکی (انقلاب) بەرپا کرد خۆی کردەوە سەرەك کۆمار • گەلی کوبا بەتیکرِاییی بەم کارە زۆر نارِەحەت بوون ، ئینجا هەر ئەمەش بوو وای لە فیدل کرد کە داوا لە دادگا بکات بۆ ئەوەی (پاتیستا) بدریتە بەر یاسا • بەلاّم هەولّی فیدل بە فیرِۆ چوو چونکە کۆنە بەرستان هەر خۆیان دادگاو یاسا بوون ! ئینجا فیدل کاسترۆ برِیاری دا لەگەلّ چەند هاورِیەی خۆی بۆ تیکوشان و رزگاری کوبا — — •

## فیدل کاسترۆ کییە ؟

لە پیشەوە ناوی فیدل کاسترۆمان هیناو ووتمان یەکیك بوو لە وانەی کە خۆی دانا بۆ هەلّبژاردنی سەرەك کۆماری کوبا • بەلاّم لە وەوپاش زۆری ناوی دەبیستین کە هەلّسا بە سەرکردایەتی شۆرِش • ئینجا لیرەوە پیویستە چەند دیریك بە کورتی لەسەر ژیانی

کاسترۆ بنووسین :

ناوی خۆی (فیدل ئەنگڵ کاسترۆ) یە لـــە مانـگی ئابی ساڵی ١٩٢٧ لە هەرێمی ئۆریانت هاتۆتە جیهانەوە لـــە خێزانێکی جوتیار • بەڵام ئەگەر پرسیار بکەین لـە چ ساڵێك لەدایك بووە ؟ لێرەدا کاسترۆ خۆی لە وەڵامـدا دەڵێ [ لەڕۆژی ٢٦ ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٣ لەدایك بوویمە ] • ئەمەش دەگەڕێتەوە ئەو ڕۆژەی کە فیـــدل لەگەڵ هاوڕێکانی هێرشیان بردە سەر قەڵای مۆنـکادۆ کەلەمە و دوا بە درێژی باسی ئەم هێرشە دەکەین •

فیدل لە قوتابخانە زۆر ژیرو چالاك بووە ، هـەر لەبەر ئەم هۆیەش مامۆستاکانی خۆشیان ویستووە • وە لەلایەن پیاوانی ئاینیشی خوێندووە •

لە ساڵی ١٩٣٣ هاتۆتە هاڤانا بۆ خوێندن و لەســاڵی ١٩٤٥ لە زانکۆ بەشی کۆلیجی یاســا وەرگیرا • وە لەبەر چاپووکی خۆی ، هەر لە زووەوە ناوی دەکردووە

لەزانــــکۆ لێژنەیەکی پێکهێناوە بۆ تێــــکۆشان دژی جیاوازی کردن لەنێوان قوتابی‌یە ڕەشەکان و سپیەیەکان بەناوی ( لجنـــة مکافحة التمییز العنصری ) چونــکە جیاوازی‌یەکی بە ئاشکرا دەکرا لەنێوان قوتابیان ، چونکە نەیان دەهێشت قوتابی‌یە ڕەشەکان بەشداری وەرزش و لێژنەکانی ڕۆشنبیری بکەن ٠ ساڵی ١٩٤٧ فیدل ویستی لەگەڵ ٢٠٠٠ کەس ڕووبکەنە کۆماری ( الدومنیکان ) بۆ بەشـــداری کردن لـــە ڕوخاندنی ڕژێمی دکتاتۆر ( تروخیلیو ) بەڵام پێش ئەوەی بچن ، ئاشـــکرا بوون و بڵاوەیان لێ کرد ٠ وە لـــە ساڵی ١٩٤٨ فیـــدل خۆپیشاندانێکی ڕێکخست لە چینی قوتابی و کرێـــکار و ـ ـ ـ دژی سەرەك پۆلیس (کارامس) ، لـە ســاڵی ١٩٤٩ دا کۆلیجی یاســـای تەواو کرد و بوبە ئاوقات (محامی) لە هاڤانا و زۆربەی کاتی خۆی تەرخان کرد بوو بۆ بەرگری لەمافی هـــەژاران و کرێـــکاران ٠ وە لەبەر هەندێش بوو زوو ناوی دەنــگی دایەوە لـــەناو

# هێرش بردنە سەر قەڵای مۆنکادۆ

قـــەڵای مۆنـــکادۆ یەکێ بوو لـــە جبەخـــــانەو بەندیخانەی کە ڕۆژێ بە سەدەها تێکۆشەر و هـــەژاری تێـــــدا ئازار دەدراو لەسێدارە دەدران بەبێ ئەوەی هیچ تاوانیان هەبێ تەنها داوا کردنی مافی گەلی خۆیان نەبێ • ئەم قەڵایە لەشاری سانتیاگۆ بوو ، هەرچـــوار دەوری بەپەرژین و جاندار گیرابوو • ئەم قەڵایە ببووە رەمزی خوێن ڕشتن هەر لەبەر هەندێش لە ناو چوونی ئـــەم قەڵایە ئاواتی هەموو گەل بوو • ئینجا فیـدل بڕیاری دا لەگەڵ هاوڕێـکانی دا هێرش بەرنە ســەری و بیگرن و بەندەکان ئازاد بـکەن و چەکەکـانیش دابەشی ســـەر هاوولاتیان بکەن • ڕۆژی ٢٦ی تەمووزیان هەڵبژارد بۆ ئەم کارە مەزنە ، لە ڕۆژی دیاری کراو فیدل لەگـــەڵ

٢٠٠ پیاو و ٢ ئافرەت ئالأی شۆرشیان هەلگرت کە بریتی بوو لە پارچە قوماشێك ووشەی (٢٦ تموز)ی لێ نووسرابوو، بەرەو قەلأی زولم و زۆرداری کەوتنە ڕێ • بوون بە ٢ لق بۆ هێرشەکە • بەلأم ئەوەی جێگای داخە سەرنەکە وتن ، هەندێکیان لێ گیراو ئەوانی تریش ڕایان کرد : فیدل کاسترۆ ش یەکێك بوو لە ئەمانە • پاش ئەم هێرشە ڕژێمی (پاتێستا) کەوتە ئازار دانی خەلکی بێ تاوان ، لە گرتنیان و تێ هەلدانیان • لە دوایی دا فیدل لەگەل برایەکەی (راول) خۆیان دابە دەست ڕژێمی کۆنە پەرست ، تاکو هاوبەشی هاوڕێکانیان بکەن لە ناخۆشی • وە هەموویان درانە بەر دادگا •

بەلأم ئەم هێرشە لەناو هەموو خاکی کوبا دەنگی دایەوە و کەس نەبوو ناوی فیدل کاسترۆ نەزانێ کە ڕێکخەری هێرشەکە بوو •

# فیدل بەرامبەر دادگا

پاش ئەوەی کەفیدل کاسترۆ و هاوڕێکانی بەند کران و درانە بەر دادگا لەڕۆژی ٢ی ئەیلولی (ستمبر) ساڵی ١٩٥٣ بۆیە ئەم ڕۆژە تایبەتی بوو لای هەموو چینە چەو ساوەکانی گەلی کوبا ، هەموو شەقامەکان لەم ڕۆژەدا پڕ ببوون لە سەرباز چونکە چاوەڕوانی زۆر شت دەکرا لەم ڕۆژەدا ـ ـ ـ ! خەڵکی کوباش لەسەر شەقامەکان ڕاوەستابوون چاوەڕوانی ئەو ئوتوموبیلەیان دەکرد کە شۆڕشگێڕان دەهێنێتە بەر دادگا ـ ـ کاسترۆیان بەدەست و قاچ بەستراوی هێنا ، و زۆر پرسیاریان لە کاسترۆ کرد بەتایبەتی ، چونکە خۆی سەرەك هێرشەکە بوو • و ئەم پرسیارانەیان لێ کرد :

بۆچی فەرمان ڕەوایی ئەم هێرشەت گرتە ئەستۆی خۆت ؟ مەبەستت چیبوو لەم هێرشە ؟ کێ یارمەتی دایت ؟ وە ـ ـ ـ ـ ؟ ـ ـ ـ ؟ هتد •

ئینجا لە وەڵامدا ووتی هەموو گەلی کوبا فەرمان ڕەوایی ئەم هێرشەیە چونکە نەمانی نۆکەران ئاواتی هەموو گەلە • وە مەبەستمان لە ناوبردنی باتیستاو دارو دەستەکەیەتی ئەم دادگایە چەند ڕۆژی خایاند • بەڵام جاری سێیەم کاسترۆ ئامادە نەبوو ، نۆکەران بۆ دادگایان ڕوون کردەوە کە نەخۆشەو ناتوانێ ئامادە بێت • ئەوەش لەبەر ئەو هۆیە بوو چونکە فیدل کاسترۆ بەرگری لە هەموو شۆڕشگێڕان دەکرد بە شێوەی ئاوقات !پارێزەر؟ • بەڵام یەکێ لەو دوو ئافرەتە کە لەهێرشەکەدا بەشدار ببوون هاواری کردو ووتی گەورەم سەرۆك دادگا فەرموو ئەم نامەیە ، دەستی بۆ ناو قژی بردو نامەیەکی دەرهێنا ، کە تیایدا ئاشکرای کردبوو من هیچ نەخۆش نیمە ! بەڵکو لێم ناگەڕێن ئامادەبم بەرگری لە هاورێکانم بکەم • وەئامادەم ژیانم بەخشمە هەموو چەوساوەکانی گەلی کوبا •

بەلام ئەم نامەیە زۆر کــاری لـــە دادگـــاکرد
تابەشێوەیەك بڕیاریان دا کەدەبێ فیدل ئامادە بێت •

ئینجا ڕۆژی دوایی کاسترۆیان هێناو لەپێش دادگا (٥) کات زمێر ووتووێژی کرد و کـــارە نالەبارەکانی (پاتێستا)و دارو دەستەکەی ڕوون کردەوە و ووتی : (بەمردن ، ژیان دەست پێ دەکات) • سێدارەی ئێمـــە دەبێتە چرا بۆ گەلی کوبا : ئینجا لە کۆتاییدا داوای لــە دادگا کرد کە لە هاوڕێکانی جیا نەکاتەوە پاش ئەمـــەی کە ١٥ساڵ حوکم درا •

## بەندیخانە

پاش ئەوەی کـــە شۆڕشگێڕان هەموویان حوکم دران و بەرەو بەندیخانەیان بردن • زۆر لە ناخۆشـیدا بوون لە هەموو بارێکەوە ، تەنیا فیدل کاسترۆ خۆی تەنیا ٧ حەوت مانگ لــە ژوورێــکی تەسك بوو ، تیشکی

ڕۆژیشی لێ دیار نــــەبوو ، ئینجـــا گواستیانەوە کن هاورێکانیان • یەکــەم کاری کاسترۆ لـــە بــە ندیخانە کردنەوەی قوتابخانەیەك بوو بۆ هاورێکانی تاوەکو فێری خوێندن و نوسین بن ، خۆشی فێری زمانی ئینگلیزی بوو لــە بەندیخـــانە ، خەریــکی خوێندنەوەی پەرتووکی مێژووی فەلسەفە بوو زۆربەی کــاتی • وە لــە ســاڵی ١٩٥٥ کاتی هەڵبژاردن هـــات ، دیسان پاتیستا خــۆی هەڵبژاردەوە پاش ئەوەی بەربەرەکانیەکی وای نەکرا کە شایانی باس بێت •

وە بەم بۆنەیەش بەندەکـــانی ئازاد کــرد لــە بەندیخانە •

## ئازاد کردنی بەندەکان

جەماوەری چەوساوەی گەلی کوبا هەرکـــە ئـەم هەواڵەیان بیست زۆر دڵخۆش بوون لە بەرئەوەی هیوایان

زیندوو بۆوه بەوه کـه شۆڕش دەست پێ دەکـاتەوەو,
ڕزگاریان دەبێ لە دەست نۆکەران •

جا جەماوەری شاری هاڤانا زۆربەیان کۆبوونەوه لـه ئیستگەی شەمەندەفەر ، تا وەکو پێشوازی لـه پاڵەوانان بـــکەن •

هەرکــــه گەیشتنه جێـــگا یەکسەر جەمـــاوەر کاسترۆیان لەسەر شانی خۆیان داناو هـاواریان کرد • ( مردن بۆ نۆکەران ، ژیان بۆ تێکۆشەران ) ، فیـــدل کاسترۆ ویستی ووتارێك بخوێنێتەوه و سوپاسی جەماوەر بکاو مژدەیان بداتێ کە دەبێ هەر ڕزگاریان بێت بەڵام دارو دەستەکەی ڕژێم ڕێگایان نەداو قەدەغەیان کرد •

## شۆڕشگێران بەرەو مەکسیك دەڕۆن

پاش ئەوەی تێکۆشەرەکان ئازاد کران لە بەندیخانە

زیاتر سورتر بوون بۆ لەناوبردنی ڕژێمی پاتێستا • ئینجا بڕیاریان دا کە شوێنێ هەڵبژێرن بۆ مەشق کردن لەسەر هەموو جــۆرە چەکێك و دەست بــکەن بەشــەڕی پارتیزانی ، وە بڕیاریان دا بەرەو مەکسیك بڕۆن بۆ ئەم کارە ، ئەوە بوو هەموویان ڕۆیشتن تەنهــا کاسترۆ و راولی برای نەبێت کە ئەمانیش لەدواییدا کەوتنە ڕێــگا بەرەو مەکسیك ، یەکەم هەنــگاوی کاسترۆ لە مەکسیك ئەمەبوو دەستی کرد بــە کۆکردنەوەی پارە بۆ کڕینی چەك ، ئەوە بوو لە کۆتایی دا توانی (٥٠٠٠٠) پەنجــا هەزار دۆلار کۆبکاتەوە و چەکی پێ بکڕێ •

(البرتومایو) هەڵستا بە مەشق کردنی پێشمەرگەکان کــە ئەو شارەزایییەکی چاکی هەبوو لە مەشق کردنو شەڕی پارتیزانی • لە شوێنێك دەستیان کرد بــە مەشق کــە هەرچوار لای دارستان بوو • نابێ ئەوەش لــەیاد بکەین لەوکاتەی کــە لەمەکسیك بوون ، چــاویان

بەگیڤارارکەوت و ناسیان • گیڤاراش پەیوەندی لەگەڵ کاسترۆ و شۆڕشگێڕەکان بەهێز کرد • لێرەدا بەپێویستی دەزانین کە چەند دێرێك لەسەر گیڤارا بنووسین تاکو لای هەموومان ئاشکرا بێت •

# گیڤارا کێیە ؟

ناوی ئەرنستوتشی گیڤارایە ، لە ساڵی **١٩٢٨**ز لە شاری (تاگراسیا)ی ئەرجەنتین لە دایك بووە لە بنەماڵەیەکی ئایینی ، کە هەردەم حەزیان لە ئازادی و سەربەخۆیی دەکرد ، دژی زۆردار ڕادەوەستان : لە خوێندنا زۆر چاپووك بووە و حەزیشی لەوەرزش کردووە بە تایبەتی یاری تۆپی پێ ، بەڵام ئەوەشمان لەیاد نەچێ گیڤارا هەر لە منالیەوە تووشی نەخۆشی تەنگە نەفەسی بووە (الربو) و زۆر کاری تێ کردووە لە ژیانیدا •

پاش ئەمەی یەکێ لە بنەماڵەی گیڤارا بە نەخۆشی

شێرپەنجە مرد ، ئەمە کاری تێ کردووە و بڕیاری داوە کە خوێندنی پزیشکی تەواو بکات ، تاوەکو هەزاران لــە مردن ڕزگار بــکات • گیڤارا زۆر حەزی لەگــــەڕان دەکرد و زۆر شارەکانی ئەرجەنتین بە پایسکل گەڕاوە،و ئاواتی ئەمە بووە کە هەموو وولاتانی کیشورەی ئەمریکا بگەڕێت •

ئامانجەکەی هاتە دی لەگەڵ یەکێ .لــە هاوڕێــکانی خۆی کە ناوی (گرنادۆس) بوو ڕێك کەوتن بۆ گەڕان بەلام لە گەشتەکەیان زۆر ناخۆشیان دیت بە تایبەتی بێ پارەیی تاوەکو تووشی هەموو جۆرە ئیشێك بوینــە وەك قاپ شووشتن لە چێشتخانە ، سەکنی ئوتۆموبیل ، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا بەردەوام بووینە لە گەشتەکەیاندا •

بەلام ئەم گەڕانەی گیڤارا کاری زۆر تێکردووە بــە ئازارو ئەشکەنجەی زۆربەی چینی چەوســـاوەی ئــەم ناوچانەی کە دیتبووی • جا بڕیاری دا کـــە هــەردەم

تێبکۆشێ بۆ ڕزگار کردنی چینی چەوساوانی جیهـــان لە هەر شوێنێ هەبن •• وەلە ســاڵی ١٩٥٣ ز کۆلیجی پزیشکی تەواو کرد و بڕیاری دا کە ڕوو لەو شوێنــە بـکات کە شۆڕشی تێدایە •

ئینجــا هاتە مەکسیك کــە ئەوکــات زۆربەی شۆڕشگێڕانی کیشوەری ئەمریــکا لەوێ بوون ، وەك پاریس بەر لەشەڕی جیهانی یەکەم ١٩١٤ ـ ١٩١٨ کـە شۆڕشــگێڕان لێ کۆبوونەوە وەك عەرەبو کــورد ـ ئەرمەن ـ ـ ـ بۆسەندنی مافی خۆیان لە عوسمانی‌یە مێژەر لەسەرەکان •• خۆین مژی گەلان ••• وە گیڤارا چاوی بە ڕاولی برای کاسترۆ کـەوت وە پاش ماوەیەك یەکتری ناساندن دەربارەی ئەم ناسینە دەڵێ :

«کاسترۆم ناسی لــە شەوێك لــە شەوانی مەکسیکی سارد لە ساڵی ١٩٥٥ وە زۆر ووتووێژمان کرد دەربارەی ڕامیاری جیهانی •• وە بەیانی بووم بــە یەکێك لــە

شۆڕشگێڕانی کوبا » • وه گیڤارا بەشداری مەشقی کرد لەگەڵ شۆڕشگێڕان ، ئینجا لـــە ٢٥ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٦ بڕیاریاندا بگەڕێنەوە کوبا •

## گەڕانەوەی شۆڕشگێڕان بۆ کوبــاو ڕزگار کردنی

شۆڕشگێڕەکان لە مەکسیك هـــەواڵیان بۆ شۆڕش گێڕەکانی ناو کوبا نارد کە لەشەوی ٢٥ی تشرینی دووەم لە مەکسیك بەڕێ دەکەونو لەشەوی ٣٠ هەمان مانگ دەگەنەوە کوبا • جا لێرەوە داوایان لە شۆڕشگێڕانی ناو کوبا کرد کـــە لە هەمان شەو دەست بـــکەن بەگێرە شێوێنی تاوەکو ڕژێمی کۆنەپەرست هەست نەکات کـە شۆڕشگێڕان دەگەڕێنەوە • ئینجا کاسترۆ لەگــەڵ ٨٢ کەس سواری کەشتی بوون : هەرچی پێویستیان پێ بوو لە تەقەمەنی و ئازووقە لەگـــەڵ خۆیانیان هێنا • بەڵام

زۆربەی شۆڕشگێڕان تووشی نەخۆشی سەرسوڕان بوون لەناو دەریا ، وە ئەمە بووە هۆی دوواکەوتنیان بە دوو ڕۆژ لەوکاتەی کە بڕیاربوو بگەنە جێ • لەوکاتە کە شۆڕشگێڕانی ناو کوبا لە شەوی دیاری کراو دەستیان کرد بە هێرش بردنە سەر پۆلیس خانەکانی شاری سانتیاگو • شۆڕشگێڕان لە ڕۆژی (٢) کانوونی دووەم گەیشتنە کوبا ، یەکەم هەنگاویان ئەوەبوو کە بە زووترین کات خۆیان بشارنەوە تاوەکو کەس پێیان نەزانی و بەرێ کەوتن بەرەو ناوچە شاخاوییە بەرزەکان ، بە ڕۆژ پشوویان دەداو بەشەو دەڕۆیشتن •

لەڕۆژی (٥)ی کانوونی دووەم شۆڕشگێڕان سەریان لێشێوا هەندێکیان لێ کوژران و هەندێکیش بەدیل گیران و ئەوانی تریش توانیان خۆیان ڕزگار بکەن ، ئەمەش لەوکاتەدا ڕوویدا کە شۆڕشگێڕان خەریکی نان خواردن بوون کە فڕۆکەی میری لەسەریان ئامادە بوو و بۆمبارانی

کردن • ئینجا لەپاش‌دا بوونە کۆمەڵ کۆمەڵ • ئەمەش دەژمێردرێ بەیەکەم شەڕ لەنێوان شۆڕش گێڕان و ڕژێمی کۆنەپەرستدا گیڤارا دەربارەی ئەم کارەساتە دەڵێ : (لەوکاتەی کە فڕۆکە بۆردوومانی دەکردین لە ئاسمان ، پیادەی ڕژێمیش گوللە بارانی دەکردین لەسەر زەوی ، من لەگەڵ چوار شۆڕشگێڕ دابڕاین لە هاوڕێکانماندا ، جانتایەکی پزیشکیم پێبوو لەگەڵ چەك جالێرەدا دوورێگا کەوتە پێشم ، یان پزیشکی وەیاخود شۆڕشگێڕی ئینجا بڕیارم دا کە چەك هەڵبگرم و شەڕ بکەم چونکە ئەوە زیاتر پێوسیت ترەلەم قۆناغە ) ، ئەوەی شایانی باسە گیڤارا لەم شەڕەدا زامدار کرا •

شۆڕشگێڕان پاش ئەوەی لەیەك دابڕان گەیشتنەوە یەك ، پاش ئەمەی زۆر ئازارو ناخۆشیان بەسەر هات لە ٨٢ کەس تەنها ١٢ کەسیان لێمابوو • وە توانیان خۆیان بگەیەننە بەرزترین شاخی کوبا کەناوی

( سیرامایسترا ) بوو • بەڵێ ١٢ کەسی چەکدار بوون بەڵام لە ڕاستیدا نوێنەری هەموو چینی چەوساوەی گەل بوون ــ ــ ــ ــ چونکە خاوەن بیروباوەڕ بوون ، هەر کەسێکیش کە خاوەن بیرو باوەڕ بێت هەر دەگات بەئاوات •

وەرگرتنی ماف لەسەر چەندایەتی چەکدار ناوەستێ بەڵکو لەسەر چۆنایەتی ئەو چەکدارانە و ڕاستی و بیرو باوەڕیان دەوەستێ • گەڕانەوەی شۆڕشگێڕان لە هەموو خاکی کوبا دەنگی‌دایەوە ، هێرشەکەی سەر قەڵای مۆنکادۆیان هاتەوە یاد کە لە ساڵی ١٩٥٣ ڕوویدا ، ئێستاش شۆڕشی گەورەی کوبا لە ساڵی ١٩٥٦ لەدایك بوو ، بۆ ڕزگار کردنی گەل و خاك لە دەست خوێنمژان ، پاش ماوەیەك خەڵکی کوبا چوونە ڕیزی شۆڕش کە زۆربەیان جووتیار بوون • ئینجا سەرکردایەتی شۆڕش بە پێویستیان زانی کە چەند

هەنگاوێك باوێن بۆ ئەوەی خــەڵك زیاتر لێیان نزیك بێتەوە کە ئەم هەنگاوانەش :

**یەکەم :**

هەڵستان بەکردنەوەی چــەند قوتابخانەیەك بۆ فێر کردنی خوێندنی مناڵە جووتیارەکان •

**دووەم :**

گیڤارا نەخۆشخانەیەکی کردەوە لە سەر لووتکەی سیرامایسترا و پێشوازی لــە نەخۆشی جووتیـــاران و مناڵەکانیان دەکرد و بەخۆڕایی چاری دەکردن •

**سێیەم :**

کاسترۆ خۆی زۆر نزیك کردەوە لــە جوتیاران و زۆربەی کاتی خۆی بە ووتووێژ بەسەر دەبرد لەگەڵیاندا ئەمەش بووە هۆی کۆبوونەوەی خەڵك لە شۆڕشگێڕان و یارمەتی دانیان •

چــوارەم :

هەر شوێنێك ڕزگار بکرایە لە خاکی کوبا یەکسەر زەوی‌یەکەیان دابەش دەکرد بەســـەر جوتیاران و بــە یەکسانی •

پێنجــەم :

پێکهێنانی ڕێکخراو لــە نێو قوتابیان و کریکاران و مامۆستایان لە شارەکان ، کە ئەمانەش ئەرکی خۆیان جێ بەجێ دەکرد بە ڕێك‌وپێکی •

ئینجا شۆڕش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەرەی دەسەند و بە هێزتر دەبوو ، خاکیان زیاتر ڕزگار دەکرد ، ڕژێمی باتیستاش ڕۆژ لـــەدوای ڕۆژ بێ هێز تر دەبوو : نــەی دەتوانی بەرامبەر شۆڕشگێڕان خۆی بگرێ و • • تاکو وای لێهات کە باتیستا لە شوێنی خۆی نەمێنێ ، لــەکوبا هەڵات باش ئەوەی کە بارەیەکی زۆری لەگەڵ خۆیدا برد بۆ دەرەوەی وولات •

بەو حاڵە شۆڕشی کوبا سەرکـەوت • کاسترۆ و ئاوەڵاکانی لە مانـگی کانوونی دووەمی سـاڵی ١٩٥٩ز هاتنە شارو بە سەربەرزی گـەڕانەوە هـاڤانا •• بەچەپڵە ڕێزان لەهـــەموو شوێنێك پێشوازی لەشۆڕشـــگێڕان دەکرا ••

ئا بـــەم جـۆرە کوبا ڕزگاری بوو لـــە دەست کۆنەپەرست و نۆکەران پاش ئەوەی گـــەلی کوبا (٣) ساڵی تێکۆشا دژی ئیمپریالیزم واتــە لەســـاڵی ١٩٥٦ ساڵی ١٩٥٩ز •

# هۆیەکانی سەرکەوتنی شۆڕش :

هۆی هەڵگیرساندنی شۆڕش بەشێوەیەکی گشتی نالـەباری باری کۆمەڵایەتی یان ئابووری یان ڕامیـاری کـە دەبێتە هۆی گۆڕینی ئەم بارە نالەبارانە و هێنانە دی بارێـکی چارەسەر کراوی باشتـــر بەرەو پێشەوە بـــە

یارمـــەتی کۆمـــەڵە شۆڕشگێڕێکی ڕۆشنبیری کـــە هەڵقووڵابێ لە دەروونی گـەلەوە • جـــا شۆڕشی کوبا هەروەکو شۆڕشانی تری گـەلانی جیهان وەك شۆڕشی عێراق لەســـاڵی ١٩٥٨و شۆڕشی فەرەنسـا و • • • • هتد • • • • چەند هۆیەك وای کرد کەسەر بـکەوێ ، ئەم هۆیانەش ئەمانەن :

١ـ **بیروباوەڕی شۆڕشگێران بەرزگاری گەلی کوبـا لە دەست خوێن مژان •**

٢ـ **ناوچە شاخاوی‌یەکان بوونە مەیدانی جەنگ دژی ڕژێمی کۆنەپەرست چونکە ئەمە باشترین شوێنە بۆ دەست پێ‌کردن بەشۆڕش •**

٣ـ **وورەی بەرزی پێشمەرگەکانی کوبا ، سەرە ڕای کەمی یا نەبوونی ئازووقەو چەكو تەقەمەنی •**

٤ـ **لە سێدارەدانی خۆفرۆشەکانی ( خائن ) خۆیـی**

دەست بەجێ • ئەم کارە زۆر پێویستە بۆ سەرکەوتنی شۆڕش چونکە هێشتنەوەیان ، لە پایەی شۆڕش کەم دەکاتەوە ، هێزی دوژمنی ناوخۆش زیاد دەکات •

٥ـ ژیری سەرۆکی شۆڕش و ئەندامەکان •

٦ـ کۆبوونەوەی چینی چەوساوە بەتایبەتی جوتیاران لە دەوری شۆڕش و تەرخان کردنی هەموو دەست کەوتەکانی شۆڕش بۆ ئەم چینە •

## دەست کەوتەکانی شۆڕشی کوبا

مانای سەرکەوتنی شۆڕش ئەوەنییە دەرکردنی نۆکەران و ڕزگار کردنی خاك و بەس ، یاخود گۆڕینی ڕژێم • • بەلام یەك ، لە هەرە پێویستەکانی ئەرکی سەرشانی شۆڕش ئەمەیە کە بەردەوام بێت لە گۆڕینی کاروباری کۆمەلایەتی و ئابووری وولات • شۆڕشی

کوبا ، پاش ڕزگارکردنی خـــاك ، بەردەوام بوو لـــە پێش کەش کردنی بەرهـــەمی بەکەڵك بۆ هاووڵاتیانی خۆی لەمانە :

**١ـ دانانی دادگا جەماوەرییەکـان بۆســزادانی ئەوکەسانەی دژی شۆڕش ڕاوەستابوون لەماوەی سێ ساڵەی شۆڕشدا ٠**

**٢ـ کەم کردنەوەی کرێی خانوو لە ٥٠٪ و کـــەم کردنەوەی نرخی دەرمان لە ٦٥٪ و ٣٠٪ ٠٠**

**٣ ـ ئازادی ڕۆژنامە ، چونکە ڕۆژنامە لـــە دەورێ پاتیستا لـــە وپەڕی کزی دابوو ، وەهیچ ئازادی نەبوو ٠**

**٤ ـ دەرکردنی یاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵ لە ساڵی ١٩٥٩ و دابەش کردنی زەوی بەســەر جوتیاران و نەهێشتنی دەرەبەگ ٠**

٥ ـ دەرکردنی یاسای نەهێشتنی نەخوێندەواری ٠

٦ ـ هێنانەدی بەرەی نیشتمانی کەپێکهاتبوو لەهەموو پارتی‌یەکانی کوبا ٠

٧ـ پێکهێنانی سوپایەکی نوێی خاوەن بیروباوەڕ لە هاووولاتیانی کوبا ٠

٨ ـ ئازادی ئافرەت و نەهێشتنی جیاوازی لەگەل پیاو بۆ ئیش کردن شان بەشانی پیاو بۆزیادکردنی بەرهەم لەکوبا ٠

# جەژنەکانی گەلی کوبا

بەپێویستمان زانی کەناوی جەژنەکانی گەلی کوبا بەرین کە دەکەونە چ ڕۆژێك ٠

١ ـ جەژنی سەرکەوتن بەسەر ڕژێمی پاتیستا ٠ دەکەوێتە (١)ی کانوونی دووەم هەموو ساڵێك

**ئەم جەژنە لە ناوچەیەك لــە ناوچــەكانی كوبا دەكرێت ، هەموو تیپی شارەكــان بەشـــداری دەكەن ، وەك جەژنی نەورۆزی گەلی كوردمان .**

**٢ ـ جەژنی ٢٦ی تەمووز بەبۆنەی هێرش بردنە ســەر قەلای مۆنكادۆ .**

**٣ ـ جەژنی كرێــكارانی نەوت ، دەكـــەوێتە ٢١ی تشرینی دووەم لە هەموو ساڵێكدا .**

**٤ ـ جــەژنی هێنانەدی یاسای چـــارە سەركردنی كشتوكاڵ كە دەكەوێتە ١٧ی ئایار .**

**٥ ـ جەژنی ئازادی قوتابی یان كـــە دەكـــەوێتە ٢٧ تشرینی دووەم لە هەموو ساڵێكدا .**

ئەمە جەژنەكانی گـــەلی كوبا بوون ، بێجـــگە لەمانەش جەژنی تر هـــەیە وەك جـــەژنی كرێــكارانی جیهان و جەژنی سەری ساڵ و . . . . . هتد .

# کۆتایی ژیانی گیڤارای نەمر

لای هەمووان ئاشکرایە کە گیڤارا رۆڵێکی زۆر مەردانە و پاڵەوانانەی گێڕا ، چ بە پزیشکی بۆ چارە کردنی نەخۆش و زامدارەکان : وەچ بە شۆڕشگێڕی بۆ تێکۆشان دژی ڕژێمی پاتێستا ، گەلی کوبا دانی بەمە هێناو زۆر ڕێزیان لە گیڤارا و کردیان بە شالیار (وەزیر)ی پیشەسازی • گیڤارا زۆربەی کاتی ژیانی وەیاخود پشوودانی تایبەتی خۆی بە ناو کارگەکاندا دەگەڕا ، ئیشی دەکرد ، شان بەشانی کرێکاران و دەکەوتە گفت و گۆ لە گەلیان و چارەی گیروگرفتەکانی دەکردن • بەڵام گیڤارا شۆڕشگێڕێکی جیهانی بوو بۆیە هەردەم بیری لە هەموو چینی چەوساوەی جیهان دەکردەوە بەگشتی و کیشوەری ئەمریکا بەتایبەتی بۆ رزگار کردنیان لەدەست داگیرکەران ، وە ئەوەشی بە ئەرکی خۆی دەزانی کە دەستی یارمەتیان بۆدرێژ

بـكات • • • ! تاوەکو لە مانـگی ئاداری ١٩٦٥ کـەوتە جیهانێکی وون • کەس نەیزانی بۆچ شوێنێك چـوو ؟ یاخود لە کوێیە هەندێ ووتیان چوویتە پیرۆ هـەندێ ووتیان نەخێر لە گواتیمالایە • • لە کۆلۆمبیایە • • •؟ !

لـــە هەمـــان کـــاتدا دوژمن پڕوپاگـــەندەی بلاودەکردەوە کە گیڤارا کوبای بەجێهێشت لەڕق گەلی کوبا چونـــکە لـــەم دواییەدا ڕێزیان نەدەگـرت • وەنۆکەرانی ڕژێمی ئەمریـــکا هەردەم ترسی ئەوەیان هەبوو بەوەی کەهـــەر شوێنێك شۆڕشی لێبایە ، وایان دەزانی کـە گیڤارا لەوێیە • لەگـەڵ ئەوەشدا ڕژێمی ئەمریکا و بەکرێ گیراوەکـــانی لـە هەموو وولاتێك بەدوای گیڤارا دەگـــەڕان ، تاوەکو دەرفەتەکیان بـــۆ هەڵکەوێ و بیکوژن •

لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٧ز ڕژێمی بۆلیڤیا پەیام نامەی دەرکرد کە گیڤارا کۆتایی ژیانی هات لێرەوە بەدەست

سوپا ، وەبەم جۆرەش :

گیڤارا لەگەڵ تاقمە چەکدارێك لـــە شاخـەکانی پۆلیڤیا دەجەنگان : تالەئەنجامدا زامـداربوو ، وەبەدیل گیرا • هەندێ لە ڕۆژنامەنووسان دەڵێن ( کـە گیڤارا بەدیل گیرا چەند ئەفسەر بەدرێژایی شـەو لەگەڵیـدا وتووێژیان کرد ، لە کۆتایی‌دا ویستیان بیکوژن ، بەڵام کەسیان دەستی نەچووێی کەبیـکوژێ و ئـەم کـــارە نالەبارەبـــکات • چونـــکە گیڤـــارا تـوانی بیـــری شۆڕشگێڕایەتی لـــە مێشکی هەموویان بچەسپێنێ تاکو بەرەبەیانی •

داوایان لە سەربازێك کرد بۆ کوشتنی گیڤـــارا پاش ئەمەی عارەقی (الماسیرادو) یان دایێ ، ئەم عارەقەش زۆر زوو مرۆڤ سەرخۆش دەکات • ئینجا ئەم سەربازە پاش سەرخۆشی گیڤـــارای گوللە باران کردو کوشتی بەدەستی ناپاکی •

دووا ووتەی ئەمــــەبوو [سلاّوو ڕێزم بــــگەیننــە خێزانەکەم (لیدا) و پێی بلّێن کــە غەمگین نەبێ ، وەبە فیــدل ڕابــگەیەنن کە ئەویش غەمگین نەبێ هــەرچی لەتوانایدا هەبوو بۆی کردم ] •

ئابەم جۆرە کۆتایی ژیانی گیڤارا هــات کــەگیانی پاکی خۆی کردە مومێك بۆڕووناك کردنەوەی ڕێــگا بۆ شۆڕش گێڕانی هەموو گــــەلانی جیهان • توانی شوێنی خۆی بکاتەوە لەناو دلّی هەموو ڕۆشنبیرێك ، ئەمڕۆش گیڤارا لەناو دلّو دەروونی هەموو شۆڕشگێڕانی گەلانی ژێر دەستە دەژی و ئەوانیش تیشك لــــە گۆڕی پاکی گیڤــــارا وەردەگرن بۆ ڕووناك کردنــــەوەی ڕێــگای خەباتیان •

## گیڤارا ••• بە پێنووسی هاوڕێکانــی

بە پێویستی دەزانم کەچەند دێرێك بنووسم لەسەر

ژیانی تایبەتی گیڤارا بە پێنووسی هاوڕێکانی :

**(١) جۆزی ئەخیلار :**

یەکێ بوو لە هاوڕێکانی گیڤارا لەمنداڵی‌یەوە • دەڵێ ئێمە هەردەم لەماڵی گیڤارابووین • هاوڕێ بەتیمان زۆر بەهێز بوو ، گەرچی ئەو لە من گەورەتر بوو بە تەمەن • بەڵام گیڤارا لە قوتابخانە زۆر زیرەك و ژیر بووە وەحەزی لە خوێندنەوە دەکرد ، بەردەوام یاداشتی خۆی دەنووسی‌یەوە لەهەمان کاتدا حەزی بەمۆسیقا دەکرد ) •

**(٢) دکتۆر فرناندو بارال :**

( ئەمن دەچوومە ماڵی گیڤارا ، پەیوەندیمان بەهێزبوو ، وەلە ساڵی ١٩٤٥ز زۆرجار بەشداریم دەکرد لەگەڵ گیڤارا بۆخۆپیشاندان : دژی ڕژێم ، هیچ نەیدەزانی ترس چی‌یە بەڵام لەیەك دابڕاین تاکو

دوایی سەرکـەوتنی شۆڕشی کوبا چاومـــان بەیەکتر کـەوت ) •

**(٣) البرتو غرنادوز :**

( مـــن کەبەشداریم کـــرد بوو لەیەکێ لـــە خۆپیشاندانەکان بەند کرام لـە ساڵی ١٩٤١ تۆماسی برام خواردەمەنی بۆ دەهێنام و گیڤـاراش لەگـــەڵی دەهات ، بەم بۆنەوە پەیوەندیم ڕۆژ لە دوایی ڕۆژ بـە هێزتر دەبوو لەگـــەڵ گیڤارا ـ وە لەســـاڵی ١٩٥٠ بڕیارم دا کـــە گـەشتێ بـــکەم بەماتۆڕ لە وولاتانی کیشوەری ئەمریکای خواروو ، وەگیڤاراش بەشداری کرد لەگەڵمدا • لەڕێـگا زۆر ناخۆشیمان دیت و هەموو جۆرەئیشمان کـــرد ، لـــە شاگردی چێشتخـــانە و پاسەوانی • • و • • • هتد • • • ) •

لە سالانی ١٩٥٦ ـ ١٩٥٩ دەتوانین زیاتر بچینە ناو ژیانی گیڤـــارا ئەویش بەخوێنـــدنەوەی نووســـینی

هاوڕێـكانی له گواتیمالا و مه‌كسیك له‌كـاتی شۆڕشی كوبا • به‌ڵام ئێمه ته‌نهـــا باسی سێیان لـــه‌و هـاوڕێ یانه‌مان‌كرد • ئه‌وه‌ی ده‌یه‌وێ زیاتر شاره‌زای ئه‌م باسه بێ بڕوانێتـــه په‌رتووكی [ گیڤارا ، سیرته ، وكتـاباته الجدیدة ]له وه‌رگێڕانی حسین فخر •

## هه‌ندێ له‌ووته كانی گیڤارای نه‌مر

١ ـ شۆڕشگێڕان ده‌بێ هـــه‌موویه‌ك بـــگرن بـۆ به‌ربه‌ره‌كانی دوژمن •

٢ ـ ئیسرائیل لـــه دروست كردنی ئیمپریالیزمـه ، ئیسرائیل لـــه هـــه‌موو شوێنێـــكه هه‌ركـــه ئیمپریالیزمی لێ بێت •

٣ ـ گیڤارا له ئه‌یلوولی ساڵی ١٩٦٤ز له باره‌گـــای نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان ده‌نـگی به‌رزكردو ووتی:

ئێمە دەنگمان بەرز دەکەین ، دیسان بەرامبەر گەلانی جیهان دەڵێین ، دژی ئەم کـارە ناڕەوایانە ڕادەوەستین کـــە لەخـــوارووی ئەفریقیا ڕوو دەدات .

٤ ـ چەنگی پارتیزانی جەنگی هەموو گەلە دژی زۆر دار ، بناغەی پارتیزانی گەلە .

٥ ـ شۆڕش نا ناردرێتە دەرەوە بەڵـکو لەناو دەروونی گەل هەڵ دەقووڵێ .

٦ ـ مەگریی وەك ئافرەت لەسەر ئەم شتەی کـەنەت توانی بەرگری لێیکەی وەك پیاو ـ ـ ـ .

# سەرچاوەکان


١ ـ كرستوفر كولومبس ـ صاموئيل اليوت مورسيون •
ترجمة : فوزى قبلاوى بيروت ١٩٥٩ م •

٢ ـ كوبا في غمرة كفاح الوطن ـ جمع وتعريب
يوسف عبده بيروت ١٩٦١م •

٣ ـ تاريخ الثورة الكوبية ـ سافير بوتيتينو : ترجمة
فؤاد ايوب بيروت ١٩٧١م •

٤ ـ گيڤارا ـ اندرو سنكلير : ترجمة ماهر كيالى
بيروت ١٩٧٤م •

٥ ـ مذكرات ارنستوتش گيڤارا ـ ترجمة ن البعلبكى
ط٢ ١٩٦٨م •

٦ ـ كوبا تحليل الثـــورة ـ ليوهر برمـــان دبول : القاهرة ٠ ٥٠؟

٧ ـ عالم حر جديد في اسيا وافريقيا والوطن العربى ـ محمـــد جميـــل بهيم مؤسسة المعـــارف بيروت ١٩٦٤م ٠

٨ ـ عالم حقائق وارقام ـ حمد محمد العيدان ١٩٧١ الكويت ط١ ٠

٩ ـ غيفارا ـ ترجمـــة حسن فخر دار الطليعـــة بيروت ط٢ ١٩٦٨م ٠

١٠ـ مجلة كاتب : عدد ٥٨ سنة ١٩٦٦م ٠

١١ـ جريدة الثورة ـ عدد ١٣ في ٣١ـ٨ـ١٩٦٨م ٠

# سوپاس

پڕ به دڵ سوپاسی ئەم هاوڕێیانەم ئەکـــەم کـــە یارمەتی‌یەکی زۆریان دام •

١ ـ عبدالحکیم عثمان ملا صالح کۆزەپانکەیی •

٢ ـ بکر غریب فرج •

٣ ـ خەدیجە محەمەد عەلیاوەیی •

٤ ـ کاك ( عبدالله عابد)ی خۆش نووس

٥ ـ کاك ( محمد بەرزنجەیی) کە سەرپەرشتی چاپی بۆ کردم •

# پێرست

